# مامۆستا ئەڵێ 6

شیعر

د.نوزاد یحیی باجگر

هەولێر – کوردستان

2021



ناوی کتێب: مامـۆستـا ئـەڵـێ
بەرگ: بەرگی شەشەم
نووسەر: د.نوزاد یحــیی باجگـر
دیزاینەر: سمیە مرادی
بڵاوکراوەی: زانکـۆی جیهان/ جیهان پرێس28
چـاپ: چاپی یەکەم (2021) هەولێر

بۆ داونلۆدکردنی ئەم کتێبانە بە بێ بەرانبەر لەم ماڵپەرانە دەست ئەکەوێت

www.nawzadbajger.org
www.nawzadbajger.net
chairman@cihanuniversity.edu.iq

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان | وەزارەتی رۆشنبیری
ژمارەی سپاردنی(196)ی ساڵی (2017)ی دراوەتێ

زانکۆی جیهان  جامعة جيهان

CIHAN UNIVERSITY

سوپاسنامە

* بۆ ڕۆحی دایکم.. و.. باوکم

* و خێزانم.. منداڵەکانم.. نەوەکانم

* و بۆ هەموو عاشقان.. هەمووچەشن

د. نەوزاد باجەلان
٢٠٢٠/١٢/١٥

www.cihanuniversity.edu.iq

# د. نەوزاد یحیـی باجـکـر .. لە ئەرشیفی بیـرەوەریمـدا

## د. وریـا عمـر امـین

من زۆر لە نزیکەوە د. نەوزاد دەناسم ، چ وەك هاوڕێییەکی دێرین ، چ وەك خزمێکی نزیك.
د. نەوزاد لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە یێکێ بوو لەو ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆستانە کە خولیای خوێندنەوە و نووسینی کوردی و کوردایەتی بوون..خۆشی لە شیعرێکیدا بە بۆنەی مردنی ( سامی شۆڕش ) ـەوە باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکات و دەڵێ:

سامی ..ئەی شۆڕش
بحەسێوە...بحەسێوە...بحەسێوە
لە سکونی موتلەقدا
لە یادمە ١٩٦٥
لە گازینۆی سیروان لە بن قەڵا
گەنجان ... دۆمینە و تاوڵە
ئێمەش کوردایەتی ئازارمان بوو
مڵاکی چای ناو پیاڵە
ئاوازی ئەی ڕەقیبمان بوو
کوردستان لە هەولێرەوە پێڕەومان بوو
....
هەر ئەڕۆین .. ئەڕۆین .. ئەڕۆین
ڕێگامان مەرگمانە
دروستکردنی ئاوەدانیی کوردستانمانە

وا بوو لە کولێژی پزیشکیی زانکۆی مووسڵ وەرگیرا و لە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پزیشك ... بەمە نەختێ لە بوار دابڕا بەڵام وازی لێ نەهێنا. پەیوەندی و عیشقی بۆ ڕۆشنبیری و وشەی کوردی بەردەوام بوو.. لە ساڵی ١٩٨٧ خوێندنی باڵای لە زانکۆی بەغداد تەواوکرد و بوو بە پسپۆر لە نەشتەرگەریی دڵدا کە لە بوارە هەرە زەحمەت و سەخت و ترسناکەکانی نەشتەرگەرییە ...ماوەیێك لە بەغداد خەریکی پزیشکییاتی بوو ..پاشان گەڕایەوە هەولێر و ڕووی کردە کارکردن لەگەڵ براکانی.
د. نەوزاد یێکێکە لە خێرخوازە دڵفراوانە پەخشندە هەرە چالاکەکانی کوردستان و شاری هەولێر .. کوردپەروەرێکی جەرگسۆز و دڵسۆزە ..عیشقی بۆ زانست و ڕۆشنبیری و خزمەتکردن و ئاوەدانکردنی کوردستان وای لێ کردووە توانینە ئابوورییەکەی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵ تەرخان بکات و چەند دەزگاییێکی خزمەتگوزاری دامەزرێنێ .. دیارترینی ئەمانە زانکۆی جیهانە لە شاری هەولێر ، پاشان لە سلێمانی و دهۆکدا..
زانکۆی جیهان گەورترین و پێشکەوتووترین و شەکاوەترین زانکۆکانی جیهانی سێیەمە..تەلارێکی زانستیی بەرزی سەرکەشە.. گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە بڵاوکردنەوە و بووژانەوە و پتەوکردنی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و وشیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا..

د. نەوزاد وەك من بیناسم مرۆڤێكی لە ڕادەبەدەر چالاك و بە توانینە..مێشكێكێكی دینامێكیی هەیە لە ئەنجامدانی كارەكانی..دەیان دەزگای گەورە بەڕێوە دەبات...ئاگادارم ڕۆژێ بە لای كەمی ١٢ سەعات بێ وەستان كار دەكات و بێ ئەوەی هیچ هیلاكبوونێكی پێوە دیار بێ.. سەرەڕای ئەم هەموو بێ كاتی و سەرقاڵییە لە ڕادە بەدەرەی موچڕكی هونەر و شیعر و ڕۆشنبیری بەری نەداوە و بەردەوام بە گیانیا دەگەڕێ.. كتێبخانەیێكی گەورەی كتێبە كوردییەكانی لە ماڵەوە پێكهێناوە كە بە سەدان بەڵگەنامە و دەسنووسی بە نرخ و دەگمەنی تێدایە... مۆزەخانەی ماڵی فۆلكلۆری كوردەواری و سەنتەری ڕۆشنبیری و دەزگای بڵاوكردنەوە و سەنتەری بەڵگەنامەكانی مێژووی كوردی دامەزراندووە.ئیزگە و كەناڵی تەلەفزیۆنی كوردیی تایبەتیی خۆی هەیە..چالاكەوانێكی ژینگەییە ، بە هەزاران نەمام و گوڵ و درەختی لە چیمەنەكانی زانكۆكە و شوێنی تردا ڕواندووە ..و گەلێ جموجۆڵی تری ڕۆشنبیری و زانستی و كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی. دەستی یارمەتی درێژدەكات بۆ هەر كارێكی ڕۆشنبیری و پشتگیریی دەكات.. لە ڕاستیدا ئەوەی د. نەوزاد بۆ بواری زانست و ڕۆشنبیریی كوردیی كردووە كەموێنەیە . لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام دەخوێنێتەوە و شیعر دەنووسێ و تابلۆ دەنەخشێنێ . تا ئیستا ٦ بەرگی بڵاو كردۆتەوە بە دەرهێنانێكی جوان و چاپێكی قەشەنگ و ڕازێنراو بە تابلۆكانی خۆی. لەگەڵ ئەلبۆمێكی گەورەی تابلۆكانی دەركردووە... شایانی باسە كە هەندێ لە تابلۆكانی بیردەربڕی سەرنجڕاكێشن.

سەبارەت بە شیعرەكانی ، د. نەوزاد بە زمانی كوردی و عەرەبی دەنووسێ ..زۆربەی بابەتەكانی لەبارەی خۆشەویستیی نیشتمان و پرسی ژیان و بوون و مردنە. ئەم شێوازە شیعرییەی د. نەوزاد لە ئەدەبی جیهانیدا باوە و بە Telegramic Poetry (شیعری برووسكەیی) ناودەبرێ.. تێیدا بە یەكدوو دێڕ بە لادانی زمانی و لۆژیكی و دەربڕینی لێڵ و نامۆ سەرنج ڕادەكێشێ. ئەم جۆرە نووسینە لە ئەدەبی كوردیدا بەرچاو ناكەوێ ... شیعرەكانی د.نەوزاد سەر بەم (ژانرەن). سۆز و ناسكی و بیری وردیان لێ بەدی دەكرێ. ئەمە لە لایێك ..لە لایێكی ترەوە شیعرەكانی د. نەوزاد سەرنجێكی زۆری ڕاكێشاوە و زۆر كەس بە دوایا دەگەڕێ .. بە (پێوانەی جیهانی) ش ئاستی هەر شتێك لە هەر بوارێكدا بە پێی ڕێژەی داواكردنیەتی. بە چ پێوانەیێك ئاستی گۆرانییێك یا فیلم یا شانۆ یا كتێبێك هەڵدەسەنگرێت؟ وەڵامەكەی لەوەدایە بە ژمارەی داواكردن و ڕوو تێكردنیان... گەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعرەكانی د. نەوزاد بكەین دەبینین ژمارەیێكی یەكجار زۆر خوێنەر بە پەرۆشەوە لێیان دەگەڕێن ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا هێما و پێوانەیە.

د. نەوزاد گەلێ دەربڕین و وێنەی شیعریی سەرنجڕاكێشی هەیە كە مایەی تێڕامانن و دەچنە بواری جەدەلییەتەوە ..بە تایبەتیی ئەوانەی لەبارەی پرسی فەلسەفیی ژیان و مردنن .. و هەندێ دربڕینی بوێرانەشی هەیە لە بارەی بوون و كردگار كە لە كۆمەڵە شیعرییەكانی (فی اللّه) و (الموت) دا بەرچاو دەكەون. لەوانەی ئیستا لە بیرمە ، كە لە شیعرە عەرەبییەكانییەوە وەرگیراوە:

ئەمەوێ مردن لە مردن تێركەم
تا مردن تێر بێ لە مردن
***
ساڵەها هەوڵم دا وێنەیێك بكێشم واتای نەبێ نەمتوانی
***
پەیژەكانی سەركەوتن بەرەو بێ پایانی
لەوێوە پایانی دەست پێ دەكات

د. وریا عمر امین

# مامۆستائەڵێ

یان مامۆستا دبێژیت... چ دبێژیت، هەتا نە چییە د ناڤ کەسایەتییا مرۆڤیدا باش فێرنابییە ئەلفوبێیا نیشتمان پەروەرییێ د گێرانا ئاخێ مامۆستا د ئەڤان بەرگاندا دبێژیت ب ستایلەکێ تازە و ب شێوازەکێ شیعری و ب سەلیقەکا زێدە جوان و ب زمانەکێ سادە و ساکار د هەمی ئەڤان پەندێن خوەدا مە دکێشیتە ڤیانا وەلاتی و ڤیانا مرۆڤان، لەورا ب هەستەکێ نیشتمان پەروەری وانەیێن خوە دبێژیت، نە شاعرم نە هونەرمەندم لێ خواندنا من بۆ ئەڤان پەندان مامۆستا هەم شاعیرە و هەم هونەرمەند، بەلکو زێدەتر زانا و ژیهاتی و مێشك دەولەمەندە، جاران مامۆستا وانەیان دبێژیت و جاران وەفادارییا خوە بۆ کەس و کار و عەردێ لێ مەزن بووی، هەڤلێرێ دکەتە ئارمانج و بەردەوام د لێگەریانێدایە بۆ روناهییەکا ئەبەدی، ئەوژی نیشتمان و سەربەخۆیا وەلاتییە، ل ئەڤێرێ جهێ ئاماژێیە بێژین، کو مرۆڤە یێ ئەڤان شیانێن دارایی و بەرنیاسی کو دەولەمەند و پزیشك ب ئەڤی ڕەنگی مال و ملکێ خوە بکەتە د خزمەتا گەل و مللەتی دا، وەکو شاعێرەکێ ژیهاتی و رەوشەنبیرەکێ مەزن و هەر کەسێ بۆ جارا ئێکێ شعرێن دیوانا مامۆستای (ئەڵێ) بخوینیت دێ وەسا هزر کەت زێدە د سادەنە، لێ ب دیتنا من ژ کویراتییا دلی دەردکەڤن، ژ حەزەکا مەزنا ئاخ و وەلاتی دەردکەڤن.
ل ئەڤێرێ دکتۆر (نوزاد یحیی باجگر ) چەندین پەیام ئێن مەزن هەم وەکو هەلویست و هەم وەکو ئامۆژگاری بۆ کەسانێن نیشتمان پەروەر بۆ ئەڤی نەوەیێ تازە کو بزانن ئەڤ سەربەخۆیە و ئەڤ ئارامییە و ئەڤ ئالایە ژ ئەنجامێ شورەش و بەرخودانێ هاتینە.
پەیڤێن شرینێن دکتۆری بکارهینانەکا هونەرییا بلند، هەمی دەربرینێ ژ ڕاستییێ دکەن، نەخاسمە دەمێ دبێژیت:

ڕاستی..... بلێ
ئەگەر........ بشمری

بەلێ، مامۆئێاڤاهییێ خوە ل سەر ڕاستییێ ئاڤاکرییە، دیسا هەتا مرۆڤ نێزیك نەبیت مرۆڤ نازانیت کو چ ئالی نەماینە دکتۆری ئیشارەت پێ نەدای، هەمی ژی دکەڤنە د چارچوڤێ زانین و زانست و پەروەردێدا و دبێژیت: (خوێندن بەنرخە) بەلێ مامۆستا، هەر چییا تە د ئەڤێ دیوانێدا گوتی یا ب نرخ و بهایە و ئامۆژگارییێن ب بهانە، ئەز دبینم هەر بەیتەکا شعرێ کەڤالەکێ جوانە و یێ کاریگەرە و ژ هەژییە ل هەمی ژورێن قوتابخانا و مالان بهێنە هەلاویستن، تێر بژین و تێر تەمەن بن.

پرۆفیسۆر دکتۆر
ئیبراهیم ئەحمەد سمۆ

# خوێنەری خۆشەویست ..

ئەو کۆبەرهەمەی بەر دەستت (مامۆستا ئەڵێ)، بەرهەمی هزر و بیری (د. نەوزاد یەحیا باجگر)ە، لە شێوە و ناوەڕۆکی شیعری ئازاددا گوزارشتیان لێ کراوە. ئەم شیعرانە دەچێتە نێو خانەی برووسکە شیعرە یا (شیعری برووسکەیی Telegramic Poetry یا وێنەی شیعری ، شیعری وێنەیی سەرنج ڕاکێش . هۆکاری سەرنج ڕاکێشی شیعرەکان بۆ گەڵێك هۆ دەگەڕێتەوە، بەکورتی بەم شێوەیە شرۆڤەیان دەکەین.

ئەم کۆبەرهەمە شیعرییە (مامۆستا ئەڵێ)، دوای ئەزموونی شیعری (فی اللە، الموت، کوردستان، پێشمەرگە، وشە دەچێنم، أزرع الکلمات، زنجیرە پەرتوکی کودستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا) دێت، بریتییە لە چەندین بەرگ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەرهەمی تێڕامانی هزرن لە بواری فەلسەفەی بیری مرۆڤایەتی و لە تێگەیاندنی بەرامبەر لە پەیامی هزردا بۆ بنیاتنانی مرۆڤ و نەشونوماکردنی وەرگر، ئەوەیان لەناوەڕۆکدا.

لە ڕوخساریشدا شیعرەکان گرنگ نین سەر بە چ ژانرێك بن، لای ئەوی شاعیر شێواز خۆیەتی و شوین پێی کەسی پێوە دیار نییە و لە کەس ناچێ خۆی نەبێ، هەروەك ڕەخنەگری فەرەنسی (جۆرج بۆفۆن) گوتەنی: مرۆڤ خۆی شێوازە. لەم شیعرانە و سەرجەم شیعرەکانی (د. نەوزاد) دا هەست بەو بۆچوونە ڕەخنەییەی شێوازی هونەری گوزارشتکردن دەکەین.

لەکاتێکدا لە ئەدەبیاتی مرۆڤایەتیدا نموونەی شیعری (جاك بریفەر ووالت ویتمان و شیعری هایکۆی یابانی) و لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردیشدا شیعری چوارینە و پۆستەرە شیعر و برووسکە شیعر سەر بەو ژانرەن کە (د. نە وزاد یەحیا باجگر) شیعرەکانی بەلادانی زمان و دەربڕینی لێڵ لە هەندێ گوزارشتدا سۆزو ناسکییەکی دیکەی بەخشیوە، سەرباری بوێری لە دەربڕین نووسیندا و نەهێشتنەوەیان بە ناکامی لە نێو ناخ و زاردا.

بوێـری و سـادەیی لـە دەربڕینـدا گـەر خاسـیەتی هونـەری شـیعری ئـەو بێـت، مەبەسـت لێـی لای خـودی د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر چ لەشـیعرەکانی یـا تابلـۆ هونەرییەکانیـدا ئاسـوودە بوونـی نـاخ و بیـره لـەو جەدەلییاتانـەی کـە هـەر دەبـێ گوزارشـتیان لـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم هەژانـەی نـاخ و هزریـش لـە مێـژە گوتویەتـی:

نە شاعیرم، نە هونەرمەند

مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

بەگشـتی ناوەرۆکـی شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دەچێتـە نێـو بابەتـی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ نیشـتیمان، بـۆ زانسـت و تێکۆشـان و بنیاتنانـی خـود و پێگەیشـتن لـە تێگەیشـتندا، پرسـی ژیـان و مـەرگ و مانـەوە لـە نەمرییـدا بـە کار و کـردەوەی چـاك، هـزری داهێنـەر و بنیاتنەرانـە، نابـێ ئـەوە لەبیـر کەیـن لای ئـەوی ئەفرێنـەر هەمـوو شـتەکان واتایـان هەیـە: ئەوەشـیان ترۆپکـی گەیشـتنی بـە مانایـە بـە مەبەسـت، سـەیرکەن چەنـد جـوان گوزارشـتی لـە بـێ مانایـی کـردووە:ـ ساڵەها هەوڵمـدا وێنەیـەك بکێشـم واتـای نەبـێ، نەمتوانـی.

د. محەمەد خدر مەولود

زانکۆی جیهان

هەولێر ٢١-١٢- ٢٠١٦

# مامۆستا ئەڵێ

خەمخۆرەکانی دونیا
بۆ چارە ... ئەجەنگن

د.نوزاد یحیی باجگر
18_6_2017
دوسلدۆرف- ئەڵمانیا



# مامـۆستا ئـەڵێ

که سواری پەڕەشوت ئەبیت
هەلتدەگرێ ... با
هاژوانت ... قەرارە
پێشی خۆت ... بە خۆت
بۆی قەرارە

د.نوزاد یحیی باجگر
18_6_2017
دوسلدۆرف- ئەڵمانیا



# مامـۆستا ئەڵێ

سەفەر ئۆغر
کۆچ سۆغر
سەفەر .. و .. کۆچ
بەینیان ...
لە ئۆغر .. هەتا .. سۆغر

د.نوزاد یحیی باجگر
25_3_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

سەفەر .. و .. کۆچ
چوونە بۆ .. هاتن
وە چوونە .. بۆ نەهاتن
سەفەر .. فەرامۆشە
کۆچ ... ؟!
دەربەدەرییە ..

د.نوزاد یحیی باجگر
فڕۆکە لندن-استنبول-هەولێر
25_3_2017



# مامۆستا ئەڵێ

کەری مرۆڤ
لە کەر ... کەرترە

د.نوزاد یحیی باجگر
18_6_2017
دوسلدۆرف- ئەڵمانیا



# مامۆستا ئەڵێ

خەیاڵم کرد
خەون ئەبینم
بۆنت ئەکەم
کارەبای ... چاوت
خەیاڵ و خەونمی هەژاند
تۆی لە من .. بڕاند

د.نوزاد یحیی باجگر
7_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

خەیاڵم کرد
خەون ئەبینم
ڕوناکی چاوت
تیشکی چاومی .. ڕوناك کرد
هێزی ناخت
تیشکی ڕوناکی .. بەهێز کرد



د.نوزاد یحیی باجگر
7_11_2017

# مامـۆستا ئەڵێ

خەیاڵم کرد
خەون ئەبینم
هەرچی خۆشی خۆشەویستیت بوو
چی خەیاڵ ..
چی خەون بوو ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
7_11_2017



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

حوکمداری حیکمەت
چالاکی حکومەت
خزمەتگوزاری بۆ میللەت
بۆ ئاینده .. هەڵمەت
ونه بۆ ڕابردوو ... خەفەت

د.نوزاد یحیی باجگر
7_11_2017
فلای دبی



# مامـۆستا ئەڵێ

حیکمەتی حکومەت
دوور بوون لە سیاسەت ..
و .. لە تجارەت

د.نوزاد یحیی باجگر
7_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

وا جیاوازی نابێت ..!
خۆشەویست بووین
هەتا شکانی ئێسك
با خۆشی خۆشەویستی
بەردەوام بێ
خۆشەویستی نەبێتە .. ناخۆشی



د.نوزاد یحیی باجگر
14_10_2017

# مامۆستا ئەڵێ

ژیان و زمان
زامی .. ژانە
وەڵامی مانە

د.نوزاد یحیی باجگر
25_3_2017



# مامۆستا ئەڵێ

ژیان و زمان
کۆچەری ... ناخە
سەفەری داخە
چی مان .. ئەژی
چی ژیان ... ئەمێنی
سەفەری کۆچ
داخی .. ناخە



د.نوزاد یحیی باجگر
25_3_2017

# مامۆستا ئەڵێ

1

کۆترەکەم ... وام ئەزانی
باڵەفڕکە ... تەقلەبازی
ئەزانم
دونیا ... ساماڵ .. بەهار
یەکەم فرینم ..
باز لە ئاسمان .. باڵی شکانم
ڕێوی لە عەرد .. چاوەڕوانی خوێتم بوو
لە 2017_1975
چاوەڕوانی چاك بوونی باڵم بووم



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

2

دیسان لە پاییز
گەڵا زەرد .. دونیا بەرد
پاش ڕەشەبا
پاش لافاوی دەرد
کۆترەکە گوتی با بفڕین
لە ژێر دروشمی هەڵۆکان
لە دووری تیری ڕێویەکان
بەڵکو ئەگەمە ئاسمان
بەڵام نەمزانی
ئەوەی لە ئاسمان
و .. ئەوەی لە ژێر ئاسمان
هەمووی جەمبازن



د.نوزاد یحیی باجگر
11_11_2017

# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
ئەنقەرە و تەهران و بەغدا
هاتنەوە
لە پاریس و لەندەن
سایکس بیکۆیان
داڕشتەوە
بۆ ئێمە و بۆ خۆیان

د.نوزاد یحیی باجگر
8_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
غەریبی غەم ..
دەکەین

د.نوزاد يحيى باجگر
8_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
لێیان ئەخۆم سێ جەم
تێر ئەبم .. برسی ئەبم
هەردەم

د.نوزاد یحیی باجگر
8_11_2017



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

من و کوردستان و غەم
کار دەکەین
بۆ نەهێشتنی غەم
ئەسوتێین بە غەم
بەڵکو .. کوردستان ئەبێتە
سەردەم و سەرجەم

د.نوزاد یحیی باجگر
8_11_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
وەك ڕێواس .. بەفر .. هەنگ
پێکەوە ئەژین .. و ..
پێکەوە ئەمرین

د.نوزاد یحیی باجگر
18_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
سێگۆشەی بەرمۆداین
ئەوەی بێتە ناومان
ون ئەبێ .. وەك خۆمان

د.نوزاد یحیی باجگر
18-11-2017



# مامـۆستا ئەڵێ

کوردستان و غەم
منیان پێ گەیاند
منیش بزر بووم
لە کوردستانی غەم
بێ ئەوەی بزانم
وەك سێگۆشەی بەرمۆدا

د.نوزاد یحیی باجگر
18_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
لە سێکوچکەی ژیان ژیاین
وەك مریشك .. هێلکەمان کرد
ڕێوی خواردی هێلکەمان
بەڵام دیسان ...
دەستمان پێ کرد



د.نوزاد یحیی باجگر
16_10_2017

# مامۆستا ئەڵێ

من و کوردستان و غەم
لە کۆشکی خەیاڵی سەربەستی ژیاین
غەمان ئەکوشت .. بە کوشتنی خۆمان
وامان ئەزانی .. ڕزگاری وایە
با بزانین ... سەربەستی بۆ ژیانە
هەندێك ژانی ... دەوایە
بۆ خۆشی ژیانە
ژانی دروستکردنی خۆشی
دەرمانە ...
بۆ .. من .. و .. غەم .. و .. کوردستان

د.نوزاد یحیی باجگر
8_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

که بۆ مردن ئەنووسم
وەك مردووەك هەست ئەکەم
به چاوم .. به فرمێسکم
شیوەن ئەکەم

د.نوزاد یحیی باجگر
8_11_2017



# مامۆستا ئەڵێ

به چاو جوان بڵێ
چاوت ئاسمانه ..
خەندەت دەرمانه ..
که چاوی هەڵدێنێ
ئەفڕی له بەهەشتا

د.نوزاد یحیی باجگر
1-6-2017



# مامۆستا ئەڵێ

بڕوا بکە ...
جێگات نیە
جگە .. لە نێو دڵ و چاوم
کامیان بتپارێزن لە ناویانە
مێشکم ئەڵێ پێیان
ئەوە .. ژیان و مانە
هەموو پێداویستی ژیان
بۆ مانە



د.نوزاد يحيى باجگر
1_6_2017

# مامۆستا ئەڵێ

خودایە ..
باش ئەزانم
چەند خۆشەویستیت
لە ناوم داناوە
بەڵام ئەوانەی
بە ناوت .. حوکم ئەکەن
ئەم کوژن
بە نەناسینت
خودایە .. ڕزگارم کەی

د.نوزاد یحیی باجگر
1_6_2017



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

برِوا بکە
قەدەحی خۆشەویستی
لە ئاوی زەم زەم پیرۆزترە
برِوا بکە
چاوت قەپات کە
ئەنۆشی ..
خۆشی خۆشەویستی



د.نوزاد یحیی باجگر
1_6_2017

# مامۆستا ئەڵێ

بەفری کوێستانی کوردستان
گەرمای بیابانی ئەفریقا
گەرم کردووە .. گەرم .. سارد
لە کوردستان .. ئەفریقا
ئەدۆزیتەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
12_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

سڵاو .. سەلام
لە خۆشی خۆشەویستی
سڵاو لە ئاشتی
نەستەقە هەستی

د.نوزاد یحیی باجگر
1_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

سەلام ... سڵاو
بای بای بۆ بڕوای ڕۆخاو
لە ژێر بیری زوخاو

د.نوزاد یحیی باجگر
1_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

ئەفرێم بە هێزی تیشك
بۆ ئەوەی خۆم بدۆزمەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
2_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

سەلام ... سڵاو
بکەنەوە ... هەموو هەموو
بەڵکو ئەفڕین .. بۆ دەریا
سڵاو بۆ نهێنیەکانی زوخاو

د.نوزاد یحیی باجگر
2_7_2017



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەگەر سارد بۆوە ... نەوە
لە .. کار .. ڕەنجکێشان
دیارە ترسی ترساندن
کاری تێکردووین
ژیانی حەسانەوەی پاش مردن
ژیانی لێ تاڵ کردووین
خودا ژیانی خولقاندووە
نەك بۆ .. مردن



د.نوزاد یحیی باجگر
18_9_2017

# مامۆستا ئەڵێ

69 ساڵ ژیام
ڕۆژی 14 سعات خولامەوە
یەك لە سەدی ٪1
ئەوەی چاندرابوو لە مێشکم
نەمدۆزیەوە
٪99 بووە ... بزر بوونم
چی کار منی دۆزیەوە
چی چاندراوی مێشکم
تەرازوومان ... نەترازە
خۆمان لە مرۆڤایەتی تێکداوە

د.نوزاد یحیی باجگر
18_9_2017



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ڕازی نەبووم
لە پێگەیاندنیان
پێی بگەی تێی دەگەی
هەتا تێی دەگەی
دەبی پێی بگەی
بۆ ئەوانەی ئەتخۆن

د.نوزاد یحیی باجگر
2_7_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

وەك مرۆڤ
سێو .. سەرەتا
لە دارێ تفتە ناخورێ
کە پێئەگا .. مێرولە .. مرۆڤ
بە پێگەیی ئەیخۆن
کە ناخورێ .. ئەکەوێ
ئەرزی .. بەڵکو تۆیەکەی
دار سێوی تری لێ برِوێ



د.نوزاد یحیی باجگر
2_7_2017

# مامۆستا ئەڵێ

وەك هێلکە ... مرۆڤی خولقاندووە
هێلکەی خۆت دروست بکە
ئازاری خۆت لە بیر بکە

د.نوزاد یحیی باجگر
2_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

ئازاری لە دایك بوونت لە بیرە
ئازاری تۆ ... دایکت لە بیریەتی
لە بیر نەکراوە .. نەسڕاوە
بەڵام ...

د.نوزاد يحيى باجگر
2_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

مۆسیقا .. و .. قاسپە قاسپی کەو
سۆزی نای .. لە بیر ئەکا خەو
هەردوکمان .. دوژمنی شەو

د.نوزاد یحیی باجگر
29_6_2017



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مۆسیقا ..
ژانت لائەبا ... هەستت گەنج ئەکا
وەك هەڵم گەرمت ئەکا
جوان جوان سازت ئەکا

د.نوزاد یحیی باجگر
29_6_2017



# مامۆستا ئەڵێ

کە مۆسیقا .. لا ئەبا ژانت
سەما بکە .. بفڕە بۆ دەرونت
لە بیر بکە بیری بێ بڕوات

د.نوزاد یحیی باجگر
29_6_2017



## مامۆستا ئەڵێ

کە مۆسیقا گوێت تان ئەکا
بۆ ئاسمان بفڕە بە سەما
تێکەڵی کە .. ناخت .. داخت
لە بیرکە .. ژانت

د.نوزاد یحیی باجگر
29_6_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

پارە هەبی ... لە پارە
بە قیمەتتر هەیە
پارە نەبی ... لە پارە
بە قیمەتتر نییە



د.نوزاد یحیی باجگر
29_6_2017

# مامۆستا ئەڵێ

عەیبم دیت .. لە هەر جێگایەك
شێوازێکە
جگە لە عەیبی .. ڕەوشتی کۆیلایەتی
لە هەموو دونیا
یەك شێوازە



د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017

# مامۆستا ئەڵێ

قوڕ بە سەر عەیب
نازانێ لە کێ خۆی بشارێتەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

سارد .. و .. گەرم لە مۆسیقا
وەکو ئاوی .. گەرم و سارد
ئاواتیان .. مان هەتا نەمان

د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مرۆڤ ... وەك هێلکە
ئای ئەگەر دەزانن
چەند بە هێزە هێلکە
سڕی خولقاندنی تێدایە
ئێوەش بخولقێنن
وەك هێلکە



د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017

# مامـۆستا ئەڵێ

هەندەك عەیبی جاران
بویتە سەربەستی تاكەكان
تاكایەتی .. پەرەی سەندووە

د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017



# مامۆستا ئەڵێ

به هەموو ڕەنگ و دەنگ
ئەکەمە ... سەما و شەنگ
بۆ ئاوازی مۆسیقا
له هەموو ... سەنگ
ئەبمە ئاوازی خۆشەویستانی
پەروەردیگار

د.نوزاد یحیی باجگر
30_6_2017



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
سامانی خوێنی شەهیدان
فرمێسکی بێوەژنان
خەڵاتی ئایندەی هەتیمان

د. نوزاد یحیی باجگر
28/8/2017



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

دەوڵەتی کوردستان
ئامانج .. و .. ئەرك .. و .. مافمان
شۆڕشی دبلۆماسیمان
وەبەرهێنانی ...
توانای ... گەنجەکانمان

د. نوزاد یحیی باجگر
28/8/2017



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان ...
پێکەوە ... ژیان
سنورمان ... ئاشتیمان
نەتەوەمان ... مرۆڤایەتیمان

د. نوزاد یحیی باجگر
28/8/2017



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی ... کوردستان
نمونەی ... شارستان
بۆ .. خۆشی .. و .. خۆشەویستی
و بۆ ... قین ... ئاگردان

د. نوزاد یحیی باجگر
28/8/2017



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

دەردی ... بوون
وە دەردی ... نەبوون
بە یەکتر ... هەڵگیرساوە

د. نوزاد یحیی باجگر
7/12/2016



# مامـۆستا ئەڵێ

مەڕ ... بۆ شوانی نابێ
شوان ... بۆ سەرکاری
مەڕەکان ... ئەفرۆشی
یان ... سەریان ئەبڕی

د. نوزاد یحیی باجگر
16/10/2017



# مامۆستا ئەڵێ

بەڕەڵاییم ... لە ئازادی بێ سنوور
دۆزیتەوە ...
لە بەربەری بیابانی ئەفریقیا
خۆم ... دۆزیەوە

د. نوزاد یحیی باجگر
2/7/2017



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

شینە ئاسمان
شینە .. دەریا و سامان
شین نیە ئاسمان
ونە ئاو
شێوازی دیتنمان
بە چاو .. و .. بە بێ چاو

د.نوزاد یحیی باجگر
6_8_2017



# مامۆستا ئەڵێ

سوار سوارێتی .. دوانزدە سوارەی
مەریوان
هێزی بەخشینی چیا بۆ مرۆڤان
هەروەك
ئاو .. بۆ .. مەل
فڕینی مەل بۆ سەر پەل

د.نوزاد یحیی باجگر
6_8_2017



# مامۆستا ئەڵێ

هەست ئەکەم .. سەفین
ئەفڕی .. لە ژێر باڵی
پێشمەرگەی دێرین
لاوازە ژین
بێ خۆشەویستی .. کوردستان

د.نوزاد یحیی باجگر
6-8-2017



# مامۆستا ئەڵێ

ژیانی بەردەوامی
ژانی لابردووم
هەستی ڕابردووم
ئامانجی داهاتووم
ژیانێکی .. بەردەوامە

د.نوزاد یحیی باجگر
6_8_2017



# مامۆستا ئەڵێ

دڵ .. شکاوەکان
داماوەکان
وەرن مەندیلێکی سپی ..
ببەستن لە سەرمان
بۆ هەڵبەستی ناخمان ...!
زاخ ... ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
7_8_2017



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

خۆراك ئەڵێ
زۆر بمخۆن
ئەتانخۆم

د.نوزاد يحيى باجگر
6_8_2017



# مامۆستا ئەڵێ

کاتت خۆشبوێ
هەموو خۆشەویستێك
تۆی خۆش دەوێ

د.نوزاد یحیی باجگر
20_9_2017



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەندەم خۆش دەوێ
ڕقم لە .. قین و لاوازیە
بە هێز .. نەمتوانی قینی ڕقم دەربکەم
بە لاوازی
توانیم دەسەڵاتی خۆشەویستی
بتەو کەم

د.نوزاد یحیی باجگر
20_9_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

برناردشۆ .. بە ناوێکی نهێنی
نەقدی لە شکسپیر .. دەگرت
وە بە ناوی خۆی ..
بەرەنگاری دەوڵەمەندی شکسپیر
دەبۆوە
ئەگەر دەتانەوێ .. وا بکەن
پێی ناوێ
وەرنە سەر شانم
بەرزتان ... ئەکەمەوە



د.نوزاد یحیی باجگر
6_8_2017

# مامۆستا ئەڵێ

بەیانی 25_9_2017
دڵۆپە دڵۆپە ..
فرمێسکی خۆشەویستیمان ڕژاند
دەنگمان لال بوو
هەستمان زاڵ بوو
بۆ ئەوانەی بۆ پرۆسەی سەربەخۆیی
گیانی خۆیان بەخت کرد
ئێمە لە ماڵ
ئەوانیش لە ئارامگای ژێر خاك

د.نوزاد یحیی باجگر
25_9_2017



# مامۆستا ئەڵێ

خودات لە گەڵ
خودات لە گەڵ
مام جەلال .. مامی گەل
ڕەهبەری گەل
بویە دامەزرێنەر
لە سەر پەل
لە قەندیل .. بە باڵی مەل
بە کۆتری سپی .. بە مەشخەڵ
خودات لە گەڵ
خودات لە گەڵ
مام جەلال .. مامی گەل



د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر 3/10/2017

# مامۆستا ئەڵێ

ئیسلامی کورد
لە زۆربەی ئیسلامان
ئیسلامترە ..

د.نوزاد یحیی باجگر
10_10_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەی پەیوەندیدار
پەیوەندیت ئاستی نەدۆزراوە
دۆزراو .. و .. نەدۆزراو
پەیوەندی نەدۆزراویان هەیە

د.نوزاد یحیی باجگر
10_10_2017
هەولێر- ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

خودای گەورە
تەنیا .. لە مزگەوت
کنیسە ... ناپەرستریێت
هەموو شوێنێك
معبدە بۆ خوا
نامەوێ .. تەنها لێی بترسێم
خۆشم ئەوێ ..
خۆشم ئەوێ ..

د.نوزاد یحیی باجگر
10_10_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سوپاس خودایە ..
خودایە سوپاس ..
لە بەهەشتی تۆ ژیاوم
بۆ بەهەشتیش ژیاوم

د.نوزاد یحیی باجگر
10_10_2017
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

دڵم ئەسوتێ
بۆ سیاسیەکان
ئەوەندە ... ئەڵێن
لە بیر ئەکەن ..
ڕاستی ڕاستیەکان

د.نوزاد یحیی باجگر
11_10_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

تورەمە ... زۆر
لە کەمی خۆشەویستی
لە نەزانینی دروستکردنی خۆشی
بە خۆشەویستی

د.نوزاد یحیی باجگر
10_10_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

برۆ .. سپی و ڕەش
ڕدێن .. سپی و هەش
لێم گەڕێن .. با ون بم
لە ناو .. ون

د.نوزاد یحیی باجگر
20_10_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لێم گەڕێن
با بخولێمەوە
لە بێ خاوەنی خۆم
هەر بخولێمەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
20_10_2017
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کوردستان دەروازەی بەهەشتە
داخراوە .. بۆ کوردان
چونکە کوردستان بەهەشتە
بێ ئەوەی بزانین
دەرگای دۆزەخمان
بۆ خۆمان کردۆتەوە
گاز .. نەوت
بۆ خۆمان کردۆتە دۆزەخ



د.نوزاد یحیی باجگر
20_10_2017
هەولێر

# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

وەرن دەردەکانم
هەموو کۆ ببنەوە
هەروەك .. 16/10/2017
کۆتایی هێنا .. بە هیواکانم
میللەت سوتا
بە نەزانین و نەزانەکانم
ئەی بسوتێ
جەهالەت و جەهالەت
لە دەرەوە .. و .. لە ناومان



د.نوزاد یحیی باجگر
23_10_2017
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مێژووی ڕەشمان
ڕەشەیاتی خەڵوزی پۆشی
کەسایەتی ناخمان
شەرمەزاری نۆشی
قیڕی نەوتی
باباگوڕگوڕی دۆشی

د.نوزاد یحیی باجگر
23_10_2017
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کوردستان ...
خەونی کورد بۆ کورد
خەونی کوردستانی ئازاد .. بۆ ئازادی
خەونی شارستان ... بۆ شارستانی
خەونی دەوڵەتی کوردستان .. بۆ ..

د.نوزاد یحیي باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
مافمانە ... ئەرکمانە
بە بێ وی نابین
بە .. وی .. دەبین

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

1

دەڵێن کوردستان
دەوڵەتی بۆ چیە ؟
ئەڵێم ئەدی ئەوان
بۆچی هەیانە ؟

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێم مەرگم هەبێ
دەوڵەتم هەبێ
لە 1070 وە 1514م .. وە
مافم نیە
حەقم نیە
تەندروستیم نیە
بەڵام خاکم هەیە
ژیانم هەیە

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

3

هەزار ساڵە .. بە کوشتنم
قینیان چاند
کوردیش وەك کەروێشك
لە ناخیان .. ماندوبوونی ڕواند
لە کوشتنمان دەزانن بۆ؟
چونکە ... دەوڵەت نەبووین



د.نوزاد یحیی باجگر
9ـ1ـ2017
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
هەبێ
کوردستان هەیە ..
وە ئەگەر نەبێ
ئارامی .. و .. ئاشتی
لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەوە بوومە دەروێشی
دەوڵەتی کوردستان
هەموو ئارەزووم
هەموو ژیانم .. و ..
ڕێگای فیکرم
بۆ بە یاسایی ناساندنی
وڵاتم



د.نوزاد یحیی باجگر
9ـ1ـ2017
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

وەرن یاران
ئەوانەی بە گوڵە
چوونە ئاسمان
با زەماوەند بکەین
بۆ سەربەخۆیی
دەوڵەتی کوردستان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئارامم و تەمەنم .. نەما
بۆ چاوەڕوانی دەوڵەتی کوردستان
نەیکەن .. ئەیکەم
ئاگادار بن
ئەچنە دەرەوەی .. دەسەڵاتتان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
ڕۆژهەڵاتی ناوەند
ئاوەدان ..
بە چی ؟
بە خۆشەویستی ژیان
پێکەوە دیلان
هەموومان جیران

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
بۆ هەموو ئاینان
بۆ گشت نەتەوان
بۆ زەوی .. و .. ئاسمان
بۆ ڕەنجبەران
بۆ دەوڵەمەندان
بۆ خوداناسان



د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
بۆ ئاخ لە دڵان
و .. سەربەستی پەروەران
هەستی ئازادان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

دەوڵەتی کوردستان
بۆ ئیسلامیان
... کریستیانان
... جولەکان
... ئێزیدیان
... زەردەشتیان
هەموو ئاینەکان
بە فیکری سەربەستی
بە ژیانی هەڵمەت
بۆ ڕزگاری میللەت
لە .. داخ .. و .. مەزەلەت



د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

## دەوڵەتی کوردستان
## سەنگەری ڕزگاری ناوەڕاستی دونیا

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
بۆ هەموو ئەوانەی کورد نینە
بۆ هۆزەکانی کورد
شارەکانی .. شاخەکانی
کوردستان .. بۆ مرۆڤایەتی

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

به دونیا ئەڵێم
دەوڵەتی کوردستان ..
بۆ پێویستییه
بۆ ڕاگرتنی قینی جەنگی
هەزاران ساڵ
بۆ دروستکردنی شارستانی
سەقامگیری دونیا

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

به دونیا ئەڵێم
تاوانی هەموو دونیا
نەناسینی مافی ڕۆڵەی مرۆڤی
کوردستان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
جیهان ..
ئاشتی .. و .. ئاوەدان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
ئامانجی .. کرێکاران
دەسەڵاتی شارستان
بۆ ئاوەدانی .. مرۆڤان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## دەوڵەتی کوردستان
## کوردستان .. یان .. مان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
بۆ مرۆڤایەتی ..
ئاڵای ئازادان

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
سوود بۆ هەموان
پارەی خۆمان
دەسەڵاتی جوامێران
ئەگەر نەبی
هیچ .. نیە
ئەگەر هەبی
هەموو شتێك .. بۆ هەموان هەیە

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
چاپی پارە
بە یاسایی
دەوڵەمەند ئەکا

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

دەوڵەتی کوردستان
لە دەوڵەمەندی
خۆبەخشی پێشمەرگە

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەمەندی .. دەوڵەتی کوردستان
لە ئاو
.. خاك
.. هەوا
.. مرۆڤ
.. ڕەوشت
دەوڵەمەندی جیهانی
بەزاند



د.نوزاد یحیی باجگر
2017_1_9
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی کوردستان
دەوڵەمەندە .. ئەگەر
دەوڵەتی هەبێت

د.نوزاد یحیی باجگر
9_1_2017
هەولێر



## مامۆستا ئەڵێ

کوردستان بێ دەوڵەت
تەنیا .. خاکە .. و .. میللەت
بە بێ عەدالەت .. و .. مەزەلەت

د.نوزاد یحیی باجگر
15_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەتا ئێستا
کوردستان نەبوو
چەنکە دەوڵەتی نەبوو
ئێستا نەبی
دوایی نابی

د.نوزاد یحیی باجگر
15-1-2017
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کوردستان بە ئاگر .. ناسوتێ
لە تینیا .. ناخنکێ
لە برسیاتی .. نامرێ
هیشك ئەبێ .. لە بێ دەوڵەتی

د.نوزاد یحیی باجگر
15_1_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

به بێ دەوڵەت
نیمانه ..
چەتری یاسایی نێودەوڵەتی

د.نوزاد یحیی باجگر
15ـ1ـ2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لە ڕەشایەتی ڕەش
ڕەش ئەڕوێ
لە گەشێتی گەش
گەش ئەخولقێ

د.نوزاد یحیی باجگر
7_2_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سوپاس خوایە
بەو مێشکەی کە پێمت دایە
بەوەی ئەیناسم
بەوەی هەست ئەکەم
سوپاس سوپاس
بۆ تۆ خوایە
بۆ ئەوەی پێمانت دایە

د.نوزاد یحیی باجگر
7_3_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

گۆران دەڵێ
جادە چۆڵ و سێبەر بوو
کاتی بەیانی بەیانی
ئەڕۆیشتم .. خەیاڵاوی ئەمڕوانی
لە پڕ .. سەرم هەڵبڕی
بەرامبەرم ... دەرکەوت وەك پەری
ئەڵێم ..
خۆزگا لە گەڵت ئەبووم



د.نوزاد یحیی باجگر
13_4_2017
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئەچمە ناو مێشکی خۆم
بە بێ ڤیزە .. و .. بە بێ سنوور
هەموو دونیا ئەبینم
بە ڕوناکی خۆر

د.نوزاد یحیی باجگر
13-4-2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هیجرەت بکەن
بۆ ناو ناخ و مێشکتان
ئەیدۆزنەوە ..
ئارامی .. و .. ئازادیتان

د.نوزاد یحیی باجگر
13_4_2017
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کەشفی توانای مێشکتان بکەن
بە .. بەکارهێنانی

د.نوزاد یحیی باجگر
13_4_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

نامەوێ ببمە سەرکردەی سیاسی
بەڵکو .. هەڵگری ئاڵای فیکری سەربەستی
بە مۆدیلی کوردستانیەتی

د.نوزاد یحیی باجگر
13_4_2017
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دڵم پێی گوتم
ماندوو بووم
با ڕاوەستم
گوتم .. با کوردستان ڕزگار بێ ..

د.نوزاد یحیی باجگر
18_5_2017



# مامۆستا ئەڵێ

دڵم پێی گوتم
ئازارم هەیە .. ئامانجم هەیە
وتم ئامانج .. پێش ئازار
بێ ئازار .. نابێ ئامانج

د.نوزاد یحیی باجگر
18_5_2017



# مامۆستا ئەڵێ

دڵم پێی گوتم
لێدانی خێرایە
پێت هەڵگرە .. لە سەر بەنزین
وتم ژیان کورتە
پێویستی بە خێراییە

د.نوزاد یحیی باجگر
18_5_2017



# مامۆستا ئەڵێ

دڵم پێی گوتم
چەند هێور .. و .. چەند ئارامی
چەند دەحەسێیەوە ..
وتم .. چاوم لە تۆ کرد

د.نوزاد یحیی باجگر
18_5_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

## جمهوریەتی کوردستان
## ئاشتی .. بۆ جیهان

د.نوزاد یحیی باجگر
6_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەن بڕوا
ژیان .. و .. جیهان
بڕوای خاوەن ..
خودای جیهان
داوای جیهان ..؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
6_7_2017



# مامۆستا ئەڵێ

ولاتێکی .. مرۆڤ خاو
پڕ تەڵە .. و .. داو
قسەی .. بێ هەنگاو
ئێستاش نیمە دراو ..؟!
ئێستا بۆ ڕزگاری گونجاو
با هەموو ببینە
دەست .. چاو
بۆ شارستانی .. سلاو
لە جیهان نەناسراو

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ- شوێنی وەستانی پاس



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەڵمەتی زانکۆی جیهان
بۆ دەوڵەتی کوردستان
لە جیهان تی ڤی .. ئامۆژگاری
جێگای پیشاندانی کولتورمان
چاغداشی .. کوردستانی

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017



# مامـۆستا ئەڵێ

ولآتێکی دەست بە سەر
ترس و لەرز .. لە داهاتوو
خوێن و فرمێسك بۆ ڕابردوو
سی و سێ شۆڕشی ڕوخاو
سێ ملیۆن کوژراو
ئایا نیمانە هەتاو
بەس نیە ..؟!
هەتا کەی نەگەین بەو ..

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

کوژراوی خەندەی تۆم
تۆم .. ئەوێ بۆ خۆم
ڕزگارت نابێ لە خۆم
خۆت .. بۆ خۆم .. ئەبمە خۆم

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

خۆم بۆ خۆم .. سەفەر ئەکەم
بۆ ناو خۆم
خۆم .. و .. خۆمەکان
دەروێشی تریفەی تۆم

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەرچی ئەکەن با بکەن
ئەرکمە شەمشەمە کۆران
قاوبدەم ...
لە ئەشکەوتی تاریکی
با ببینن .. تیشکی ڕوناکی
گەرچی چاویان نابینی
بینین فێر ئەبن
بە ئاسانی

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

پۆلەندا ..
دەسەڵاتی کۆمۆنیستیان گۆڕی
ئایا بۆ ناتوانین
وڵات دروست بکەین
ئەتوانین .. ئەتوانین

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

با بچینە سەر وەیس
وەیسی خۆمانە
پرسیاری لێ بکەین
خەتای کامانە
شێخ وەیس .. ئەڵێ
لێی گەڕێن خەتای کامتانە
ئێستا ئەرکی هەمووتانە
کوردستان ... دەوڵەتی هەمووتانە
هەموومانە ..
و مردووەکانمان ئەڵێن ..
دەوڵەتی کوردستان ئاواتمانە



د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ

# مامۆستا ئەڵێ

با بچینە ... قەندیل
بەفری کردیتە .. مەندیل
مەندیلی ئاشتی ..
ئاو .. و .. ئاگر
ئاسمان .. و .. زەوی
دروست ئەبن
ئاشنا ئەبن
بە دەوڵەتی .. دەلیل ..؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

کوردستان دەوڵەت
.. خەڵات
بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

د.نوزاد یحیی باجگر
9_6_2017
وارشۆ



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

کوردستان ..
وەکو دەوڵەت هات
تیرۆر هەڵات

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر دەوڵەت ..
دروست کردنی ئەزیەت نەبی
چۆن مردن لێمان هەڵات
ئێسقانەکانی شەهیدان
لە پیستەی خۆیان
دۆڵ لێ ئەدەن
بۆ دەوڵەتی کوردستان
ئاگادار بن
لە مەکری جاشان



د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
وارشۆ

# مامۆستا ئەڵێ

کوردستان دەوڵەت
لە مێژە ئاوات
چاوەڕوانی دەسەڵات

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
فڕۆکەی وارشۆ-استنبول



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کوردستان دەوڵەت
بۆ ئاسمان .. دەسەڵات
بۆ ڕەفیق .. داوەت
بۆ مرۆڤ سەربەست
ئاشتی ..
بۆ جیهانی ناوەڕاست



د.نوزاد يحيى باجگر
10_6_2017
فرۆکەی وارشۆ-استنبول

# مامـۆستا ئەڵێ

ئێوەش هەندێ شت ئەبینن
کە .. گەیشتن بە تەمەنی من
کە ئێستا .. باوەڕی پێناکەن

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
فرۆکەی وارشۆ-استنبول



# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

تەمەن .. چەرخ .. و .. فەلەکە
دەست پێ ئەکا
ئەسورِێ .. ئەسورِێ
رِائەوەستێ
یاری نیە ...
یاری پێ ئەکرێ



د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
فرۆکەی وارشۆ-استنبول

# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستیەکانی مێشکم
دیل ئەبێ
چی .. سەربەستی ئەزانێ دیلی چیە؟
چی .. دیلی سەربەستی ئەخایەنێ ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
فرۆکەی وارشۆ-استنبول



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مێشکم ئازادیەکانی جولاند
نەی زانی
ئازادی ڕاستەقینە چیە ..
دایپۆشت .. دایپۆشت
هەتا .. ئازادیەکان داپۆشران
بە دیلی ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
فرۆکەی وارشۆ-استنبول



# مامۆستا ئەڵێ

پێم ئەڵین
تۆ ئەمانەت نۆشیوە ؟
وتم من نا
مێشکم لە حالەتی
خۆشەویستی مطلق

د.نوزاد یحیی باجگر
10_6_2017
وارشۆ



# مامۆستا ئەڵێ

شەقام ..
شەق لە مەقام ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
14_6_2017
هەولێر - ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

ئەی شەمشەمە کوێرینە
لە تاریکی ئەشکەوت نوستینە
قاوتان ئەدەین .. بەرەو خۆر
ئەزانین .. کاتێ ئەبنی کۆر
بەڵام لە ڕوناکی ئەبنە .. زۆر
عاشقی تیشکی خۆر

د.نوزاد یحیی باجگر
17_6_2017
وارشۆ



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئاگاتان لە مامۆستا بێت
مامۆستا ئەتاوێتەوە
چی بکەین؟
خۆی بۆ خۆی ئەتاوێتەوە
بۆ دروست کردنی
مامۆستاییێکی تر



د.نوزاد یحیی باجگر
23_2_2018

# مامۆستا ئەڵێ

ئەتوانم .. ناتوانم
هەموو ناتوانەکانم
ئەکەمە .. توانا
بۆ خۆشەویستیت
هەر ئەبێ بتوانم

د.نوزاد یحیی باجگر
23_2_2018



# مامۆستا ئەڵێ

تەنیا حیکمەت
چالاك كردن .. و .. هاندانی
کەرتی تایبەت
بۆ خزمەتی میللەت

د.نوزاد یحیی باجگر
6_11_2018



# مامۆستا ئەڵێ

مردم لە ژیان
دەیان جار
بۆیە ئەژیم لە مردن
یەك جار

د.نوزاد یحیی باجگر
6_11_2018



# مامـۆستا ئەڵێ

بیر .. و .. بڕوایە
تەنیا بە تەنیا
لە ژیان .. و .. دوا ڕۆژ
هەڵگیرسانی مەشخەڵی
ئاینی خودا
بۆ ڕوناکی .. و .. ڕەوشت بەرزی
بیر .. و .. بڕوا



د.نوزاد یحیی باجگر
16_3_2018

# مامۆستا ئەڵێ

له هەر شوێنێك بتبینم
عاشقی ئەم جێگایە ئەبم
بۆنی خەیاڵی تۆ ئەبینم
وەك ژوان .. هیلانە ئەبینم

د.نوزاد یحیی باجگر
7_2_2018



# مامۆستا ئەڵێ

دەرچوانی زانکۆی جیهان
بە دوای کەس مەکەون
سەرداری خۆتان دروست بکەن

د.نوزاد یحیی باجگر
10_3_2018



# مامۆستا ئەڵێ

مۆسیقا ژەن
کە مۆسیقا ئەژەنی
ژانی ژیان
بکە سەیران

د.نوزاد یحیی باجگر
23_2_2018



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مردنم .. لە ژیان
ژان و ژوان بوو
ژیانم لە مردن
هێمنی .. و.. سکون
یەکەم جارە هەست ئەکەم
بە ژیانم .. لە مردنم



د.نوزاد یحیی باجگر
23_2_2018

# مامۆستا ئەڵێ

بوون .. و .. نەبوون
تەواوکەری ... یەکترن
زۆربوونی ... بوون
نەبوون ... کەم ئەکا
کەم بوونی ... بوون
بوون ... زۆر ئەکا

د. نوزاد یحیی باجگر
7/12/2018



# مامۆستا ئەڵێ

بوون .. و .. نەبوون
بە مادیەت .. و .. ڕوحانیەت
سەما ... ئەکەن .. پێکەوە
وەك ... دونیا .. لە گەڵ ڕۆژ !؟
ڕۆژ .. و .. شەو
بە شەو ... بوونەکانی ڕۆژ نابینی
بە ڕۆژ ... بوونەکانی شەو
ئا لێرەدا ... بزرمان کرد
پەیوەندیەکانی ...
ڕۆح .. و .. مادە



د. نوزاد یحیی باجگر
7/12/2018

# مامۆستا ئەڵێ

تەنیا ... چارە
زانیین .. و .. کارە
بۆ ئایندەی ... ئەوجارە

د. نوزاد یحیی باجگر
30/10/2018



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

هەستی ... دۆستی .. ڕاستی
بە ڕاستی ... ڕۆژهەڵاتی
بیر .. و .. بڕوایا
لێی دەرئەکەوی ...
مەبەستی ... خۆشەویستی

د. نوزاد یحیی باجگر
11/7/2018



# مامۆستا ئەڵێ

ئێمە ... شێوازی شێوازین
بە مامۆستایی ...
بۆ دامەزراندنی ... شێوەکاری

د. نوزاد یحیی باجگر
11/7/2018



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

بەڵێ ... بەڵێ
وا ... بڵێ
بۆ سەربەستی
وا ... بڵێ

د. نوزاد یحیی باجگر
11/7/2018



# مامۆستا ئەڵێ

مردیەکانی ژێر شورەی
قەڵای هەولێر ...
شەهید .. و .. دوژمن
تێکەڵاوی ئامانجی فکری
مردن ...
لە ئێوە ... مردم
لە مردنتان ... ژیام
لە مردن ... دەرچووم
بۆ ... ژیان

د. نوزاد یحیی باجگر
25/3/2018



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مردیەکان ... ئەمرن
لە مردنی ... مردن

د. نوزاد یحیی باجگر
25/3/2018

ئەستەنبۆل



# مامـۆستا ئەڵێ

مردیەکان ... مردنیان
لە بیر چوو ...
لە شاخی خۆشی ... ژیان

د. نوزاد یحیی باجگر
25/3/2018



# مامۆستا ئەڵێ

ئەمەویَ بە سوود بم وەکو مەڕ
شیری ... ماست و پەنیرە
خوری ... جلك .. و .. مافورە
ریخی .. سوتەمەنی بە پیتە
گۆشت .. و .. جەرگ .. و .. پیستەی بە
سوودە
سەرم ببڕن
سودی لیَ وەربگرن
مەڕ ... لە پڵنگ .. و .. ڕیوی .. و .. گورگ
بە سوودترە .. بۆ ئێوە



د. نوزاد یحیی باجگر
7/12/2018

# مامۆستا ئەڵێ

1

سەد .. مەڕ .. و .. بزن
دوو ... سەگ
یەك شوان ... و .. شوانكارە
ئاغا ...
بەڕێوە ئەبەن ... مەڕ
ئەدۆشن ... ئەبڕن ... ئەفرۆشن
لە شوانەوە ... هەتا ... ئاغا
ئەخۆن ... مەڕ .. و ... ماڵ .. و .. حاڵ
ئەدەن ... بە صاحب قڕان
دوو ... مسقال ..



# مامۆستا ئەڵێ

**2**

مەڕ ... دەباعێنین .. باع ... باع
کە دەیاندۆشن ... خوریان دەبڕن
کە سەریان دەبڕن ... گۆشتیان حەڵاڵە ..
کە خوریان ئەبڕن ... برینیان زوڵاڵە
ئای مەڕ ... لۆ نەبویە گورگ
بەڵام ...
هەر ئەمێنێ ... مەڕ
ئەبێتە هزر ... بۆ ژیانتان
بۆ دەسەڵاتتان



د. نوزاد یحیی باجگر
7/12/2018

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئایا .. شمس تەبریزی ..
یان جلال الدین الرومی
کامیان ... وەستای کامیانن
شمس ... أستاذە ...
رۆمی ... مامۆستایە ...
أستاذ ... تەقینەوەی ڤۆلکانی مامۆستایە
مامۆستا ... دروست ئەکا
چەشنەکانی ... أستاذی

د. نوزاد یحیی باجگر
19/10/2018



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەفلاتۆن ... یان ئەرستۆ
باوکی فەلسەفەی یۆنانە ..!؟
فەلسەفە ...
فیکری ... کۆکەرەوەی ئادەمیزادە
ئادەمیزاد ... نادیارە



د. نوزاد یحیی باجگر
20/10/2018

# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەتی ... کوردستان
خاکی ... مافێکە
گەرچی ... بووە بە خەون .. و
دیتنی خەونەکە ... ترسناکە
بڕواو ... بیرو ... ناخ .. و
هەستی میلەتێکە
دێتە دی دڵنیام
ماف ... ئەبێتە ئەرك

د. نوزاد یحیی باجگر
8/5/2018



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

برِوا .. و .. بیرم
هەیە ...
خاك ... و .. زمان .. و .. مێژووم
هەیە ...
مرۆڤ .. و .. گەنج .. و .. نەسلم
هەیە ...
برِوا بکەن .. مافمان
هەیە ...
دێتە دی ... دەبێتە
ئەرك ... یان ... مەرگ



د. نوزاد یحیی باجگر
8/5/2018

# مامـۆستا ئەڵێ

بیرو ... بڕوا
چارەسەرە .. و
چارەسەری ... هەیە

د. نوزاد یحیی باجگر
8/5/2018



# مامۆستا ئەڵێ

برِوام ... بە کوردستان
بێ ... سنوورە
بە ... مرۆڤەکانی .. کوردستان
ئایندەیەکی ... مسرورە
پێویستمانە ...
خۆمان ... و ... خاکمان
برا .. و .. دۆست ... بین

د. نوزاد یحیی باجگر
9/5/2018
طائرە- ئەستەنبول - دبی



# مامۆستا ئەڵێ

خۆم .. و .. خەمەکانم
دروست بووین بۆ دروستکردنی
بڕواکانم ... مافەکانم
ئەرکەکانم ...
خۆم لە بیر کەم
خەمەکانم ... لە بیر ناچێ

د. نوزاد یحیی باجگر
9/5/2018
طائرە- ئەستەنبول - دبی



# مامۆستا ئەڵێ

هەموو ساڵێك ... سێ جار ئەمرم
حەوت جار ... زیندوو ئەبمەوە
لە حەفتا ساڵی ژیانم
280 زیندوو بوونەوەم ماوە



16/1/2019
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

هەموو ساڵێك ... ساڵ ئەدۆزمەوە

16/1/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چل و هەشت ساڵە نەمدیوە ..
فرشتە ... هاتە لام
وتی ... چۆنی ..
وتم ... چۆنی ..
وتی ... ئەمناسی ؟
وتم .. خوای گەورە .. هێزی خۆشەویستی
فێر کردوومە ..

**16/1/2019**

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هێزی خۆشەویستی
ئاگر ... ئەسوتێنێ
جوانی ... سەربەستی
روح ... ئەدوینێ
خۆشی ... ئەڕوێنێ

16/1/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

نانوم ... لە نوستنم
ئەژیم ... لە مردنم

16/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە ... خۆزگە
گریابام ... بە چاوم
تا وشك ئەبوو ... فرمیسکم
دڵم ... مێشکم ... هەناسەم
ئەگرین بە شێوازی خۆیان
لە نەزانینی ...

27/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پێڵاوم ئەگری بۆ پێم
پێم لە ژانە بە پێڵاوم
پێڵاوو .. و .. پێم .. پێکەوە
لە ژان .. و ... ژین

27/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

گریان بە چاو
ئاسانترین گریانە
سوتانی گریان
دڵ ئەسوتێنێ
هەستی ... زیندوو .. و ... مردوو
یەکسان ئەکا

29/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بهێڵە ... گریان
چاوت .. و .. ناخت .. بشوا

29/1/2019
هەولێر



# مامـۆسـتا ئـەڵێ

قەدەری میللەتی نەزان ...
لە دەست نەزانانە ؟!

29/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

قەدەری میللەت... لە ملتان
هێزو ... زانیاری.. و .. هاوڕێیەتییە

29/1/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

نەمان بوو .. ئارد .. و .. ئاو
ئەژیاین .. بە دەردی خاو
هەتا هات
کوردستانی سەربەخۆ

20/2/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

نەمانبوو ئامانج
ئەژیاین کرمانج
هەتا هات
کوردستانی سەربەخۆ

20/2/2019

هەولێر



# مامـۆستـا ئەڵێ

1

کوردستان ...
زیخەکانت ... گەوهەرە
دارەکانت ... قەڵەمە
لوتکەکانت ... سەربەرزییە ......



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

2

ئاه ... كوردستان
وا تەمەنم بەرەو نشێوە
نەمدی وەكو دەوڵەت
هەر ئەبینم .. ئەبینم
ئەم خەونە
لە گەڵ من گەورە بووە
روحەكانم ... ئەبینن
با بنیات بنێین دەوڵەت
مەدەنییەت ... بە هەڵمەت
زانكۆكانی جیهان
ئێوە ... سێ كوچكەی بناغەی
دروستكدنی ... وڵاتن



26/2/2019

هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

لە گەڵ سەرکاری گوندی بووینە
ریزبەندی
بەندی ... بەندییانمان
لە خەون ... رزی

7/3/2019
هەولێر



# مـامـۆستـا ئـەڵـێ

ئەی ئەوانەی ... خۆشی خۆشەویستی
ئەزانن
تەگەری ... نەخۆشی
مەخەنە ناو خۆشەویستی ...

7/3/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سەرەتا ئەڵێ
ساردی هەناسەم
گەیشتە ناو ناخم
دوور ... و .. نزیك
نە دەچم ... نە دێم
دەچم .. و .. نایێم
من دوور ... ئێوە نزیك
هەرگیز .. من .. نایێم



7/3/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کاك سەتار ئەڵێ
بەسە .. بەسە .. بە گڵ بمشۆن
وەکو ئارد ... بمشێلن
بە ئاو بمخۆن
من لە زیندانی بەندایەتی ژیان
ئازاد بووم
ئازاد بووم



7/3/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کاك ستار ئەڵێ
من ئاو بووم لە ناو ئاگر
نەکوڵام ... نەبرژام
دروستم کرد ... ڕوناکی خۆشەویستی

7/3/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کاك ستار ئەڵێ
مردن کۆتایی نییە

7/3/2019
هەولێر
براغ-چیك



# مامـۆستا ئەڵێ

کچی جوانی کوردستان
ئەزانی لە بەفر سپی تری
ناسك و نۆڵ و جوان
خۆزگە بە خۆت
لە چاوم جوانتری ..

1/4/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بە دەردی دەردم قەسەم
بە 14ی نیسان مەئتەمی ئەنفالم
قەسەم ...
مامۆستاییم ... ببێتە قوربانی

1/4/2019
هەولێر
براغ-چیك



# مامۆستا ئەڵێ

ساردم کەرەوە
سستم کەرەوە
بمتەزینەوە
بە ئاگری ناخم بمبرژێنەوە
کۆڵ نادەم
لە خۆشەویستیت

**12/5/2019**
**هەولێر**



# مامۆستا ئەڵێ

تەندوور ... ئەسوتێنم
ئارد ... ئەبرژێنم

12/5/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

که قسە دەکەم
ئازاد دەبم لە ناو مێشکم
هەندەك وشەم لێ ئەکەوێ
هەندەکیش قوت ئەدەم

24/5/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له هەموو شت ... دە قاتم هەیە
بەڵام تێر نەبووم
لە خۆشەویستی و عەشق

11/6/2019

هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

لە هەموو پێداویستیم
زۆر زیاترم هەیە
بەڵام هەمیشە لە عەشق
هەژارم

11/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەیانی جوان
کوردستان
ڕۆژ باش
ئەی ڕۆژ
تۆ ئەرکی ژینمی
هەناسەی ناو .. گۆڕمی
کوردستان

23/9/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

مام .. مام .. نەمام
ئەوانەی ... نەمان ... مان
و ... ئەوانەی مان ... نەمان
چییە ... مان .. و ... نەمان
نییە .. مان .. و .. نەمان

23/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کە شەست ساڵ
ڕۆژی 14 سعات فێر ئەبن
ئینجا وەرن لێکۆڵینەوە بکەن
بۆ ئازارم

23/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێن سفر ... سفر
سفر چییە
سفر ... نییە
ئێمە داماوانە ... دەستمانپێکرد

23/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەنگە .. سەر ...
شار .. و .. دار
سەنگە .. سەر ... سەنگ و سەر
داوام لە خودایە ..
سەنگی سەرم ..
هەندی سەنگەسەر ..... ؟!

23/9/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چل چرا
لە ژێر چل چل
لە ساباتەکانی سەر ڕوباری
چۆمان
لە حەفتاکان
کوردەواریمان فێری
کوردستان کرد ..
بە شێوازی خۆبەخشی ژیان
بۆ کوردستان

23/9/2019

هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

چاوە جوانەکانی دونیا
جوان دیتنیان خستە دەریا
ماسی و نەهەنگ
شەپۆل و دەنگ
چاوی ڕوون (بینان)
کۆر کرد بە تفەنگ

29/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەردی سەر بەرد
بە قورسایەتییان هەڵبەستراوە
لە سەر یەکتر هەڵپەسێردراوە
مرۆڤیش .. بە ڕەوشت

29/9/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

پەنجەرەی پارم ... پێوەدا ...
پەنجەرەی داهاتووم کردەوە

16/10/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له زەردەخەنەی مردن بێزار بووم
هەر نەهات ... لە تاریکی ژیان
ڕۆژم هات
مردن و ژیان یەك ڕێیە
بە ... هات ... و ... نەهات

16/10/2019

هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

پێشوازی مردن
ژیان بەختیار ئەکا
مردن ترسی نییە
ترسی مردن
ژیان ترسناك ئەکا

16/10/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

چاو جوانەکەم
زیندانی خۆشەویستیت
فراوانترە لە ئاسمان
ئاسمان نزمترە
لە سەربانی زیندانت

28/10/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دووکەڵی دەردی دونیا
دونیا ئەکاتە زەریا
زەریا ئەبێتە دەریا
دەریا نقوم ئەبێ ... لـــــە ... ؟!

23/9/2019

هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

نرخی ناخی خۆبەخشی خامۆشە
خەندەی خەرمانی خۆشەویستی ...
فەرامۆشە

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کورد ... تایبەتمەندی خۆی هەیە
کوردی ڕەسەن ... ئەیزانێ

30/6/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من هەناری کوردستانم
هێشتا مزرە ... دەنکەکانم
بیخۆن کە بووە مێخۆش

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پێم ئەڵێن ماندوو بووی
بەسە...
ئەڵێم ئەگەر ماندوو نەبم
حەسانەوەم بۆ چییە ؟
ئەگەر ئاگر نەکوژێنمەوە
ئاوم بۆ چییە ؟
خۆشەویستی نەچێنم
ژیانم بۆ چییە ؟

30/6/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

پێم ئەڵین ... بویە حەفتا
هێزت مایە هێشتا
ئەڵێم بیست و بیست ... بیستی لە گەڵ
و بیستی چاوجوانی هەولێری
و بیستی برۆ سپی هەولێری

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کە شوشە ئەشکێ
چاك نابێتەوە
پارچەکانی کۆنابێتەوە
کۆی بکەیەوە
خۆت بریندار دەکەی !

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

شەمشەمەکوێرە
لە تاریکی ئەشکەوت نوستینە
قاوتان ئەدەم ... بەڕوو خۆر
ئەزانم کاتی ئەبنە کۆر
بەڵام فێر ئەبن ... ژیانی زۆر

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتێبخانەی سەربەستی لە هەولێر
سەربەستی کردوین ...
چاپخانەی ... کێو
چاپی کوردستانی ... فێرکردووین
پیربالٚ محمود ... ئازادی کردووین
شێخی چۆلی ... کۆی کردووین
سوتاین ... بۆ هەولێر
هەولێر ... ڕوناکی کردووین



30/6/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

شتە ڕەشەکان لادەن
جیاوازکەرەکان ... لادەن
پێداویستییەکانی ژیان سازکەن
بە خۆشەویستی نازکەن
شتە جوانەکان جوانتر کەن
شتە ڕەشەکان لادەن

30/6/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

به ڕەنگەكانی ... خەو
خەون ببینن
به ڕنگەكانی بەهار
گوڵ ... بچینن
به ڕەنگەكانی شەو
ڕوناكی ببینن
به ئاسوودەیی و خۆشی و خۆشەویستی
وڵات و ژیان ببینن



30/6/2019

هەولێر

## مامۆستا ئەڵێ

خەتای ... خەڵوزی ڕەش
سوتاندن ... نییە
ڕەش کردنە

11/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پارە و چەك .... لە كوێ بێت
بڕیار ... لەوێیە

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پڕ پڕ ... لە جامی شەرابی
شاهنشای شەوان
کەم کەمی ... لێ ڕژا
خەونی خەوان
هەتا بووە ڕۆژهەڵات

30/6/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له سەر خاك نوستم
له ئاسمان ... خەوتم
له دەریا ... سەربەستم
هەتا بزانم ... چییه مەبەستم

11/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ببمە بای باران
بروسکی دژی ... زۆرداران
تا بڕوخێنم ...

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من بوومە ... شاهنشاه
شاهیەتیم ... نەدیت
بوومە ... دەروێش
دەروێشیم ... نەدیت
زامدار بووم
برینم ... نەدیت
جگە لە ... خۆشی خۆشەویستی
هیچی ترم ... نەدیت



1/7/2019
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

من بوومە .. خەون
ڕاستەقینەم دیت
بە دیتن ... نەهات
هات بە ... نەدیتن

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من بوومە ... بومەلەرزە
نەمرِوخاند ... بەڵام لەرزاندم
جێگای لاوازم چەسپاند

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من بوومە ... بوومەلەرزە
لەرزینی ... ڕوخانی ژێرزەمین
دەڕوخێنێ ... ئەلەرزێتی
ئەسوتێنێ ... ڕوخاندن

1/7/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەترسم لە ئاسایشی موتلەق
هەرگیز نییە ... ئاسایشی .. بە بێ سنوور

1/7/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

## بەسیەتی ... بێ سەرووبەری

1/7/2019

هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

## چەند بمناسن ... ئەتانناسم

1/7/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر نەتوانم ... چاکتری بکەم
چاکی ... ئەچێنم
بۆ ئەوەی ... چاکی بدوورینەوە

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

به ڕوحییەتی پێشمەرگە
کار بکەین
کار بچێنین ... و ... بیدوورینەوە

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کوردستان ... تامەزرۆی
بردنەوەیە ...
دەبێ بردنەوە
فێر بین ...
بگەڕێینەوە ...
بۆ ڕەوشتی پێشمەرگایەتی
چونکە پێشمەرگایەتی ... پیشەمانە



1/7/2019
هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

با نمونەی ... پێشمەرگە
بکەینە ... ئامانج
لە هەموو پێداویستیەکانی ژیان

1/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

**خۆم ... و ... یارە جوانەکانم**
**فیدات بم ... کوردستانەکەم**

**1/7/2019**
**هەولێر**



# مامۆستا ئەڵێ

کوردستانەکەم ...
دەوڵەتیش نەبی
لە زۆر دەوڵەتان ... بەرزتری
با ببینە مۆدێلی ڕۆشەنبیری

**1/7/2019**

**هەولێر**



# مامـۆستا ئەڵێ

وڵات پەروەری ...
چەند خۆشە

1/7/2019
هەولێرا



# مامۆستا ئەڵێ

## خاوەن خەونی ... ڕۆحی خۆمم

1/7/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مۆدێل ... مۆدێل
بۆ خۆت ...
و ... بۆ ئەوانی تر ...
مۆدێلی کار
مۆدێلی ... خۆشەویستی
مۆدێلی پێشمەرگایەتی

29/7/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ڕەنگ ... و ... دەنگ
ئاین ... و ... ژیین
گوڵ ... و ... دڕك
دەرگام شكاند
ژوورەوەم نەدیت

29/7/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

دونیا ... هێزە
چاوشین ... قژ زەرد
من دژی تۆ نیم
هێز ... و ... ووزە
بەشی هەموومانە
قژ زەردی چاوشین
من دوژمن نیم
دوژمنایەتی نازانم

25/7/2019
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

بـــا ... کوردستان
بکەینە ... زانکۆ

27/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لەیلا ... لەیلا
شەش چاو ... شەست ئاوات
زندووی ... زندووی
لە کوردستان

27/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له بیر نەچووی
له بیرمی
بەهار و پایز ... نەبووی
ڕۆژهەڵات بووی
له بیرچوونی ژیان بووی
له بیرەوەری داهات بووی
ڕۆژان ... ڕۆژ بووی



27/7/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

شیعر ... و ... هونەرەکانم
باری سەرشانم سوك ئەکا
سامان ... و ... کارەکانم
باری سەرشانم .. قورس ئەکا

27/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

که شەپۆلی شارستانی ... دەڕوا
هیشکی ... تەمبەڵی ...
نەزانی دێت
که شەپۆلی دێ
ئاوەدانی ... زانیین ..
بەختیاری دێت
له گەڵ شەپۆلی شارستانی
مەله بکە



27/7/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوزی خاکی زیندوو
زیندووترە لە خاکی خۆخۆر

30/7/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## خەلوزی خاکی خۆڵەمێش
## بۆ سوتانیش ناشێت

**30/7/2019**

**هەولێر**



# مامـۆستـا ئـەڵێ

خەرمان خاکە
خاك ... خەرمانە
بۆ بەختیاری ژیانە

30/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خائی ... خاك
... خەرمان
... خەون
... خەڵات
... خەبات
خەونی خەڵاتی خەرمان
خەبات خاکە

30/7/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

مامۆستا ئەڵێ
خەم لەم وڵاتە
خورمایە.

30/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاك ... لەم وڵاتە
خۆڵە.

30/7/2019
هەولێر



# مامــۆستا ئەڵێ

خەون لەم وڵاتە ...
خەباتە.

30/7/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوزی ئەم وڵاتە...
ئەڵماسە.

30/7/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

خاوێنی ئەم وڵاتە ...
خاوەنداریيە.

30/7/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەهەشتی خۆت بدۆزەوە
لە ناو خۆت .. و .. لە دەرەوەی خۆت

30/7/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له ساڵ ... ساڵانم
ساڵێکم ... مانگێکه
له دیدەوانی ... مانگانم
مانگم ... ڕۆژێکه
ساتەکانم ... مانگێکه
مانگیشم ... عصرێکه
عصریشم ... چرکەییێکه



26/8/2019
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

له ساڵ ... له مانگ
له ڕۆژ ... له سات
درۆیه ... تەرازووی زەمەن

26/8/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئەی برۆ ... سپی
جگە لە خۆشەویستی
ئەوەی دیکە هەمووی درۆیە

25/8/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مەرد ... مەردی مەردانی
مەردی لە ژیانە
پێش ئەوەی لە ژانە
مەردایەتی بۆ ژیانە

26/8/2019
هەولێر



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەزاران ساڵ ...
و ... یەك چرکە
پاڵپشتی ....؟!

26/8/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

منیش نازانم ...
چیە ... چرکە .. سات .. ڕۆژ
مانگ .. ساڵ .. عەسر
ئێمە داماننناوە
بۆ پێویستی .. ژیانمان
ئایا هەیە ؟ ڕاستەقینەیە ؟
نا نا ... لا .. لاّ وجود للزمن



26/8/2019
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

زەرد ... سۆر ... سەوز
سپی ... ڕەشم ... ڕواند
بە بێ ڕەنگ ... دەرچوون

26/8/2019
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

زەرد ... بەر .. و .. پایز  و  زستانە
سەوز ... بەر و بەهار و هاوینە
شین ... بەر و بەرزی ئاسمانە
هەموومان ... لە نێوان زستان و هاوینین
لە بەرزی ئاسمانی شینین
نادیارە ... نادیارە



28/8/2019
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

ئەوەی نەوێری ... بە خۆی
بە کەس ناوێری

28/8/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

شێر و ... شیر ... و ... شیر
و ... شەڕ
هەرچوار شاو
لە شەوی ڕوناکی شەڕ
شاو ئەکەن
شێر و ... شیر ... و ... شیر
و ... شەڕ
سەما ئەکەن
پێکەوە ... ژان .. ژیان و ژوان
ئەکەن



29/8/2019
هەولێر

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

چوار ... چواردە
چوار سەدو ... چواردە
چوار جاران سەدو چواردە
دەکاتە .. چ+چ+چ= صفر
چیت پێ بڵێم ... مامۆستا ؟!

29/8/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سەرم سوڕما
لە سودمەندەی ... سورمایی
چی سەرم ... سوڕی خوارد
چی سۆری سەرم
سۆری سەلماند

29/8/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵـێ

دەرگای ... دۆزەخ
داخراوە ...

29/8/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەی خۆشتی بوێ
چەند بەختیارە
ئەدەم ... ئەدەم
هەموو شتێکم ئەدەم
بۆ چاندنی هەستی بەختیاری

6/9/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سێ چاوم هەبایە
یەك لە ئاسمان
دووەم لە ژێر خاك
سێیەم لە ناو خۆم
ئینجا ... دونیام بە ڕاستی ئەبینی



6/9/2019
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

شیر .. شییر .. شیر
سێ ... شین
شیناتیان لێ شین بوو
شەکر .. شەونم .. شەوین

**12/9/2019**
**هەولێر**



# مامۆستا ئەڵێ

سوپاس بۆ خودا ...
سوپاس بۆ ئیسلام ...
منی فێرکرد ..
خۆشەویستی ژان و ژیان
لە کوردستان ...

14/9/2019
هەولێر
استنبوڵ



# مامۆستا ئەڵێ

سوپاس بۆ خاکی پیرۆز ...
سوپاس بۆ ئاردی خەڵوز ..
سوپاس بۆ ئاگری نەورۆز
پیرۆزە ... نەورۆز
سوتانی ... خەڵوز

14/9/2019

هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

به داخەوە ... به داخەوە
میلەتم ... خەسیەتی .. ڕوانگای
ئەوەی نەبینراوە .. ئەبینی
ئەوەی بینراوە ... نابینی
ئەوەی هەیتی قیمەتی نیە ؟!
بۆ ئەوەی نیەتی دونیا وێرانە ؟!



14/9/2019
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

شەمشەمەکۆرینە
لە ئەشکەوتی تاریکینە
قاوتان ئەدەم بەرەو خۆر
ئەزانم کاتێ ئەبنە کۆر
لێرادێن لە جوانی ڕوناکی
بە سەربەستی .. و .. دڵپاکی

14/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەستەخانەی جمهوری
مێژووی هەولێری
هەوارگەی نەخۆشەکانی
ئاوازی شەهیدەکانی
مەڵبەندی پزیشکانی
بمری مردن .. بژی ژیان

14/9/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

میژوو ... ئەتانسرێتەوە
ئاینده ... ئەمانبوژێنێتەوە

17/9/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

" شەهید "
چی بەوانە بڵێم ...
خۆیان .. و .. تفنگیان لە ناو بەفری تەزی
چی بەوانە بڵێم ...
لە ناو خوێن و عارەقەی مەیین
چی بەوانە بڵێم ... باوکیان نەدی
چی بەوانە بڵێم
ئەوانەیان لە بیر نەبێ
چی بە منداڵەکانم بڵێم
ئەڵێن بابا ... بۆ وەها بی
وا باشە ... ئەڵێم
با لە ناو مرکبم ... بخنکێم
هەتا ... وا نەبی



26/8/2019

هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

وا باشە ئەوەی نەیڵێم
بیڵێم ...
چونکە ئێستا نەیڵێم
سوودی نیە ؟!

1/10/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێن ... با وابڵێن
دەربەدەری نەناسینی
دوور دوور ئەکا ناسینی
عەشقی مەعشوقی ڕێگای ناسینی
بەهەشتی ... بەهەشتە

1/10/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دروست بکەن ... دار الحب
بۆ دارِشتنی ... خۆشەویستی
کە هەموو .. خۆشەویستەکان
لە ناو بەهەشتی بەهار
ئەژین

1/10/2019

هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

دروست بکەن ... دارالحب
هەتا تێبگەن لــە ...
خۆشەویستی دایك

1/10/2019
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بۆ دروستکردنی ... دار الحب
هەموو کات ... جێگا هەیە
لە خاك ... و .. لە ئاسمان
خۆشی ... بۆ خۆشەویستی
خۆشەویستی ... بۆ خۆشی
دار الحب ... دامەزراوە

1/10/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەلورەی ... نەقش
ئاوازی ... پەخش
خۆشی ... نۆش
ڕزگاری ... هۆش

**1/10/2019**

**هەولێر**



# مامۆستا ئەڵێ

ئەو ئاگرەی ... ئەمسوتێنێ
بە ئاگر ... ئەیکوژێنمەوە
ئەو قینەی ... ئەمڕوخێنێ
بە خۆشەویستی ... ئەیخنکێنم
ئەبمە نمونەی ... خولقاوی خوا
بۆ ڕۆژهەڵات .. و .. ڕۆژئاوا

12/10/2019
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کەی ... ئەمرم
ڕزگار ئەبم لە سامانەکانم
کەی ... ئەژیم
لە مردنم ... بە هونەرەکانم

12/10/2019

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

وەرن ... یاران
تەماشا کەن
ناوی ... ناوم
ئینجا ... ئەزانن
دەوڵەتی کوردستانە
تەنیا ... دەرمانم

د. نوزاد یحیی سعید
22/2/2019



# مامۆستا ئەڵێ

لە دوای جەنگ ...
جەنگی ... مان و نەمان
جەنگی دروست کردنی ... ڕەوشت
جەنگی ئاسوودەیی .. و .. هێمنی .. و
دامەزراندنی دەسەڵاتی یاسا
دەست پێ دەکات

د. نوزاد یحیی باجگر
8/7/2019



# ژیاننامــه

## د. نەوزاد یەحیا سعید خدر ئەلیاس محەمەد باجگر

١) لە رۆژی ٢٨ شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی زاینی لە هەولێر لە دایکبووە.
٢) باوکی یەحیا سەعید باجگرە و دایکی مەکییە ئەحمەد سەمەد سەعدوڵایە، سێ براو و چوار خوشکی هەیە.
٣) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی فەیسەڵییە و دواتر لە ئەربیل ئولا ئیبن خەلەکان بە زمانی کوردی تەواوکردووە، مامۆستایان ناسح داود لە (حساب) بیرکاری و فوئاد موعەلیم لەوێنەکێشان یەکەمین مامۆستای ئە و قۆناغەی بوون.
٤) قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی هەولێر خوێندووە و مامۆستا(مەکی) یەکەمین مامۆستایی خوێندنی ناوەندییەتی.
٥) قۆناغی دواناوەندی، لە دواناوەندی هەولێر تەواوکردووە، مامۆستا خەلیل عەبدوڵلا یەکەمین مامۆستای ئەو قۆناغەی بوو.
٦) لەپایزی ساڵی ١٩٦٧ لەکۆلێژی پزیشکی ـ زانکۆی موسڵ وەردەگیرێت.
٧) ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات و دەبێتە پزیشك.
٨) ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەبێتە پزیشکی نیشتەجێ و پاشان سەرۆکی پزیشکانی نیشتەجێ.
٩) ئەندامی بەشداری یەکێتیی نووسەرانی کورد بووە لەبەغدا ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.

١٠) لەساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ راژەی سەربازی ئیلزامی دەیگریتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی (زاخۆ، هەولێر، رواندز) وەك پزیشکی سەربازی دەست بەکاردەکات.

١١) ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ وەك پزیشك لەگوندو ئاواییەکانی ناوچەی گەلاڵە خۆشترین ساتەکانی ژیان بەسەردەبات.

١٢) وەك پزیشکی پسپۆری گشتیی لە مستەوسەفی سێتاقان لەهەولێر دادەمەزرێ.

١٣) دەبێتە پزیشکی ئێمرجنسی لەنەخۆشخانەی کۆماری لە هەولێر.

١٤) دەبێتە پزیشکی راهێنەر لە نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن و پاشان نۆرینگەی تایبەتی ئێواران دەکاتەوە.

١٥) یەکەمین سەنتەری نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن لەکوردستان و لە هەولێر دادەمەزرێنێ، لەگەڵ د. ولید خالد لەنەخۆشخانەی جمهوری ساڵی ١٩٨٢.

١٦) لەوەزارەتی تەندروستییەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا - کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدیین ١٩٨٣.

١٧) راهێنانی نەشتەرگەری دڵ وسیینگ لە - مدینة الطب - لەبەغدا ئەنجام دەدات لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا یوسف نعمان ساڵی ١٩٨٣ و لێکۆڵینەوە لە پسپۆری نەشتەرگەری دڵ و سینگ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٧ ، زانکۆی بەغدا – مدینة الطب، لە نهۆمی نۆیەم، چوار ساڵی لێکۆڵینەوەیی و راهێنان لەوێ تەواو دەکات.

١٨) دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە - مدینة الطب، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدا لەتشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ دبلۆمی باڵای نەشتەرگەری دل و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن وەردەگرێت.

١٩) دەگەڕێتەوە شاری هەولێر  وەك پزیشكی پسپۆری نەشتەرگەری دڵ وسینگ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی سەلاحەددین دەست بە كاردەبێت.
٢٠) وەك پزیشكی پسپۆر لە نەخۆشخانەی (رزگاری) لە هەولێر لە ساڵانی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ دەست بەكار دەبێت.
٢١)ساڵی ١٩٨٨ دەگوازرێتەوە بۆ كۆلێژی پزیشكی زانكۆی موستەنسەرییە، نەخۆشخانەی یەرموك، عیادەی پزیشكی تایبەتی خۆی لە بەغدا شەقامی مشەجەر، باڵاخانەی باقر ئەلباقر دەكاتەوە هەتا ١٩٩٦.
٢٢) ساڵی ١٩٩٦ ئەچێ بۆ توركیا و میسرسین.
٢٣) پرۆسەی هونەری شێوەكاری لە خانوی تایبەتی ـ ژوری وێنەكێشانی خۆی لە كۆمەڵگای سولی لە لێواری دەریای ناوەست دەسپێكردوە.
لەبواری هونەری تەشكیلی(٢٢٠) تابلۆی هونەری تەشكیلی كێشاوە.
لەبواری شعریشدا چەندین شیعری ئازادی كوردی و عەرەبی نووسیوە.
٢٤) ساڵێ ٢٠٠٣ دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیران لە شاری هەولێر، چالاكییە خزمەتگوزاری و بازرگانی و زانین و زانستییەكانی پەرەپێدەدات، لە تەواوی شارەكانی كوردستان و عێراق دا چالاكانە خزمەتگوزارییە زانسستیی و بازرگانییەكانی گەشە دەكەن.
٢٥) بەشداری دەكات لە پرۆسەی بوژاندنەوەی ئابوری و وە بە رهێنان لە كوردستان و عێراقدا.
٢٦) چەندین كۆمپانییای جیهانی لە دوبەی، مێرسین، عێراق، سریلانكا و بەریتانیا دادەمەزرێنێ.
٢٧) ساڵی ٢٠٠٧ زانكۆی جیهان ـ هەولێر دادەمەزرێنێ.
٢٨) سالی ٢٠٠٩ بانكی جیهان بۆ وەبەرهێنان لە عێراق  دادەمەزرێنی.
٢٩) قوتابخانەی جیهان بۆ سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دادەمەزرێنێ.

٣٠) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان ـ بۆ ئاوەدانکردنەوەیە.
٣١) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری جیهان ـ بۆ خزمەتگوزاری نەوتە.
٣٢) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری خێرخوازی حاجی یەحیایە.
٣٣) دامەزرێنەری ئێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیهانە لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨ .
٣٤) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ سلێمانییە لە ساڵی ٢٠١١.
٣٥) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ دهۆکە لەساڵی ٢٠١٣.
٣٦) دامەزرێنەری مەڵبەندی راوێژکاری و توێژینەوەی زانستیی و یاسایی جینۆسایدە.
٣٧) دامەزرێنەری یانەی وەرزشی جیهانە لەساڵی ٢٠١٠ .
٣٨) ئەندامی کۆمەڵەی جیهانییە بۆ نەشتەرگەری دڵ.
٣٩) ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیاییە بۆ نەشتەرگەریی دڵ.
٤٠) ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکان، رۆژنامە نووسان، ژووری بازرگانییە.
٤١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتیی گیانەوەرانە.
٤٢) دامەزرێنەری کۆمەڵەی پاراستنی ژینگەیە.
٤٣) خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری زانکۆی جیهانە.
٤٤) تا ئێستا دەیان کتێبی چاپکردووە، لەوانە: (ووشە دەچێنم، ازرع الکلمات ، في الله، الموت، پێشمەرگە، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا(١٠بەرگ)، الالبوم فن التشکیلي ، زنجیرە پەرتوکی مامۆستا ئەڵێ ...).
٤٥) چەندین کتێبی تازەی ئامادەی چاپە لەوانە (ئاشتی، لیلا، هزر ...).
٤٦)سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمینداریەتی زانکۆکانی جیهانە (هەولێر، سلێمانی، دهۆك).
٤٧) سە رۆکی ئە نجومە نی ئە میندار یە تی زانکۆی (ئەربیلی نێودەوڵەتی)یە.

٤٨) دامەزرێنەری (ئەکادیمیای جیهان)ــە بۆ پەرەپێدان و فێرکردنی پیشەیی.
٤٩)کۆلێژی قەڵا بۆ دیراساتی ئاینی لە ساڵی ٢٠١٨ دادەمەزرێنێت.
٥٠) لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی وەبەرهێنەرانی کوردستانە.
٥١) ئەندامی رێکخراوی ئاشتی جیهانییە، رۆژی (٢٠١٦/٦/١٤) دەبێتە باڵیۆزی ئاشتی جیهانی لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانی کە لە تونس بەسترا.
٥٢) پرۆژە ئایندەییەکانی بریتین لەمانە:
١) دامەزراندنی تۆڕی زانکۆکانی نێودەوڵەتی(International Network of Universities) بە مەبەستی بوژاندنەوە و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لە نێو گە لاندا.
٢) کردنەوەی زانکۆ لەشارە گەورەکانی عێراق و کوردستان.
٣) خوێندنی مافی منداڵان و ئافرەتان لەقوتابخانەو زانکۆکاندا.
٤) بڵاوکردنەوەی پرۆژەی نا بۆ توندووتیژی خێزان، ئافرەتان، منداڵان.
٥) دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری جیهان و پاشان کردنەوەی کۆلێژی پزیشکی و دەرمانسسازی و پەرستیارییە.

بڕوام وایە (تەنیا چارە ... زانین و کارە)

"The only solution is education"

پزیشکی ڕاوێژکارییە، هونەرمەندی تەشکیلییە، شاعیرو بزنسمانە.